ناوی کتێب: کچی ئازیز

بابەت: تێڕامان، وتە و ئامۆژگاری

ئامادەکردنی: سەلمان باقی

پێداچوونەوە: حەیدەر ئیبراهیم

دیزاین: دارەوان یاسین

چاپ: چاپخانەی تاران

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

ناوەندی بڵاوکراوە:کتێبخانەی بەختیاری

ساڵی چاپ: ٢٠٢٢

# پێشەکیی ئامادەکار

خوێنەری خۆشەویست، ئەم کتێبەی بەردەستت کۆکراوەی بیر و بیرخەرەوە و ئامۆژگارییە لە شێوەی وتەی جواندا بۆ هەموو کەسێك. گەورەیی و بەخشندەیی خودای میهرەبان بەرامبەر بەندەکانی پیشان دەدات.

پێکهاتووە لە چەند بابەتێکی گرنگی وەکوو سەبرگرتن، ئامۆژگاری، بیرخستنەوە، نەفس و ڕێکپۆشی.

ئامانجی ئەم کارە یارمەتیدانتە بۆ:

- مامەڵەکردن لەگەڵ کێشە سەرەکی و لاوەکییەکانی ژیانت.
- فێرت دەکات چۆن مامەڵە لەگەڵ نەفستدا بکەیت.
- چۆن لە کاتی تەنگانەدا ئارام بگریت.
- چۆن گوێڕایەڵی خودایش دەکەیت.

وتەکان لە چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆرەوە وەرگیراون و وەرگێڕانیان بۆ کراوە.

وتەکانیش بە گشتی لە ئیبن قەیم و زانا و بانگخوازەکانی ئیسلامەوە وەرگیراون، قورئانی پیرۆز و فەرموودەش لەخۆ دەگرێت.

بە هیوای ئەوەی هەموو کەسێك سودی لێ وەربگرێت.

سەلمان باقی

بەهاری ٢٠٢٢

## پێڕست

# Contemplation of Allah's benevolence

## تێڕامان لە بەخشندەیی خودا



Your life is nothing more than a love story,
between you and Allah. Nothing more.
every person, every experience,
every gift, every loss, every pain
is sent to your path for one reason
and one reason only: to bring you back to Him.



ژیانت جگە لە چیرۆکێکی خۆشەویستی
لە نێوان تۆ و خودادا، هیچی تر نییە.
هەموو کەسێک، هەموو ئەزموونێک،
هەموو دیارییەک، هەموو لەدەستدانێک، هەموو ئازارێک
بە هۆکارێک دەنێردرێتە سەر ڕێگەکەت
تەنها بە هۆکاری ئەوەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی.

Sometimes there is a hidden beauty
in the way we fall, a hidden blessing
every time we fail. Because sometimes
Allah destroys our plans before our plans
destroy us.



هەندێک کات جوانییەکی شاراوە لە کەوتنماندا هەیە،
ڕەحمەتێکی شاراوە لە هەموو شکستێکماندا هەیە.
لەبەر ئەوەی هەندێک کات خودا پلانەکانمان لەناودەبات
پێش ئەوەی پلانەکانمان لەناومان ببەن.

Stick to the boundaries of Allah
because they are truly there
to hold us back from evil.
Realize that once you have crossed them,
then nothing will stop you from the haram.



پابەندی سنورەکانی خودا بە،
چونکە سنورەکانی بۆیە دانراون تا لە خراپەکاری بمانگەڕێننەوە.
ئەوە بزانە گەر جارێک بیانبەزێنیت،
دواتر هیچ شتێک لە حەرام ناتوەستێنێت.

We are not promised a pain free life.
We are not promised a journey without waves.
We are promised that if we hold onto the rope
of Allah, and stay within the lifeboat of His
remembrance, nearness and mercy,
the waves will come.
But they will, never ever drown us.



ئێمە بەڵێنی ژیانێکی بێئازارمان پێ نەدراوە.
ئێمە بەڵێنی گەشتێکی بێ شەپۆلمان پێ نەدراوە.
ئێمە بەڵێنمان پێ دراوە گەر دەست بگرین بە فەرمانی خوداوە
و لە بەلەمی ڕزگاری یادکردنی، نزیکی و ڕەحمی ئەودا بمێنینەوە،
شەپۆلەکان دێن.
بەڵام هەرگیزاوهەرگیز نوقممان ناکەن.

When we fail in life,
we can't undo the mistakes,
but it's never too late to make a change.
Think of the coming days
as chances to make that change.



کاتێک لە ژیانماندا شکست دەهێنین،
ناتوانین هەڵەکە بگەڕێنینەوە،
بەڵام هەرگیز درەنگ نییە بۆ ئەوەی
گۆڕانکاری لە ژیانماندا بکەین.
وەک دەرفەتێک بیر لە ڕۆژانی داهاتوو بکەرەوە
تا ئەو گۆڕانکارییە بکەیت.

One thing I've always found to be
so beautiful about Allah is the fact
that not only can He forgive you,
but He wants to forgive you,
He would love to forgive you.



شتێک هەیە کە هەموو کات پێم وابوو زۆر جوانە
سەبارەت بە خودا ئەویش ئەو ڕاستیەیە کە نەک
تەنها دەتوانێت بتبەخشێت، بەڵکوو دەیەوێت بتبەخشێت،
حەزی لێیە بتبەخشێت.

Allah can change your situation
in the blink of an eye,
in ways you don't even know.
Don't feel panicked, trust Allah completely.
The Answer to your prayers will manifest soon.



خودا دەتوانێت لەچاوتروکانێکدا بارودۆخت بگۆڕێت،
بە ڕێگایەک تەنانەت خۆشت نەزانی چۆن.
هەست بە ترس مەکە، بەتەواوەتی باوەڕت بە خودا هەبێت.
بە زوویی وەڵامی نزاکانت دەدرێتەوە.

One teardrop that falls from the eye
of a believer out of love and fear for Allah,
is better than this world and everything it
contains.



دڵۆپە فرمێسکێک کە لە خۆشەویستیی خودا یان
لە ترسی خودا لە چاوی ئیماندارێکەوە دەکەوێت،
لەم جیهانە و تەواوی ئەو شتانەی تیایایەتی باشترە.

Allah's mercy is so great, He sends us
in this world only for some days and
if we live these few days like He has ordered,
He'll grant us Jannah where we'll live always
with infinite happiness.



ڕەحمی خودا زۆر گەورەیە، ئەو بۆ چەند ڕۆژێک
ئێمە دەنێرێت بۆ ئەم جیهانە،
ئەگەر بێتو ئێمە ئەم چەند ڕۆژە کەمە بەو شێوازە
بژین کە ئەو داوامان لێ دەکات،
بەهەشتمان پێ دەبەخشێت کە بۆ هەمیشە
بە خۆشییەکی بێکۆتایی تیایدا دەژین.

Allah knows you're tired.
He knows it's hard for you.
But know that Allah will never
put you in a situation you can't handle.
Your struggle has a purpose.
Your pain has a purpose.
Your blessings will come soon.



خودا دەزانێت ماندویت،
دەزانێت کە قورسە بۆ تۆ.
بەڵام ئەوە بزانە کە هەرگیز خودا تۆ لە بارودۆخێکدا
دانانێت کە نەتوانیت چارەسەری بکەیت.
تێکۆشانت مەبەستێکی هەیە.
ئازارەکەت مەبەستێکی هەیە.
بەختەوەریت زوو دێت.

Its said that
beautiful things
are often felt in the heart
and not seen with the eyes.
This is an excellent example of
how we can't see Allah,
but we feel his existence deep down in our hearts.



وتراوە کە زۆر جار شتە جوانەکان
لە دڵدا هەستیان پێ دەکرێت و
بە چاوەکان نابینرێن.
ئەمە نموونەیەکی نایابە کە
چۆن ناتوانین خودا ببینین،
بەڵام لە ناخماندا هەست بە بوونی دەکەین.

If Allah can take away something
you never imagined losing,
then surely Allah can grant you
something you never imagined gaining.



ئەگەر خودا بتوانێت شتێکت لێ بسەنێتەوە
کە هەرگیز پێت وانەبووە لەدەستی بدەیت،
ئەوا بەدڵنیاییەوە لە توانایدایە شتێکت پێ
ببەخشێت کە هەرگیز پێت وانەبووە بەدەستی بهێنێت.

She sinned, you talked bad about her,
you criticized her, you judged her,
you insulted her but she prayed
and asked Allah to forgive her,
she repented for her sins,
now she become better than you.



ئەو گوناهی کرد، تۆ قسەی خراپت لەسەر کرد،
ڕەخنەت لێ گرت، بڕیارت لەسەر دا،
سوکایەتیت پێ کرد، بەڵام داوای لە خودا کرد
لێی خۆش بێت، لە گوناهەکانی تۆبەی کرد،
ئێستا ئەو لە تۆ باشترە.

Don't let this dunya fool you.
Going university is great,
having a good job is all well,
but when we stand before Allah
He isn't going to ask about our degrees.
He will ask why we neglected
our Salah and disobeyed Him.



مەهێڵە دونیا بتخەڵەتێنێت.
ڕۆشتنە زانکۆ شتێکی نایابە.
هەبوونی کارێکی باش، زۆر باشە،
بەڵام کاتێک لەبەردەم خودا دەوەستین
دەربارەی بڕوانامەکانمان پرسیارمان لێ ناکات، بەڵکوو
لێمان دەپرسێت کە بۆچی نوێژەکانمان فەرامۆش کرد و
بێگوێییمان کرد.

There's nothing more beautiful than a knowledgeable person who teaches you about the deen, improves your imaan, and make you fall in love with Allah. Such person is a gem. If you ever find one, don't lose them.



هیچ شتێک جوانتر نییە لە کەسێکی زانا
کە دەربارەی دین شتت فێر بکات،
ئیمانت بەهێز و زیاد بکات و وات لێ بکات
خودات خۆش بوێت.
ئەم جۆرە کەسە گەوهەرە، گەر
لە هەر کاتێکدا کەسێکی وات دۆزییەوە،
لەدەستی مەدە.

Every breath we take is taking us closer to death.
The time we spend in this world is short,
the time we are held in our graves is long,
and the punishment for following our lowly
desires is calamitous.



هەر هەناسەیەک کە دەیدەین نزیکترمان دەکاتەوە لە مردن.
ئەو کاتەی لەم جیهانەدا بەسەری دەبەین کەمە،
ئەو کاتەی لە گۆڕەکانمان دەمێنینەوە زۆر دورودرێژە
و سزای شوێنکەوتنی ئارەزوە نزمەکانمان زۆر بەئێشە.

Everyone should recite or memories Surah Mulk,
it's only 30 verses.
the Prophet of Allah (PBUH) said:
"This Surah will protect one from the punishment
of the grave when recited before sleeping.
And this Surah will intercede for him
until his sins are forgiven".



پێویستە هەموو کەسێک سورەتی (الملک) بخوێنێت یان لەبەری
بکات.
تەنها سی ئایەتە.
پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت)فەرمویەتی:
هەرکەسێک لەپێش خەوتن ئەم سورەتە بخوێنێت،
ئەوا لە ئازاری ناو قەبر دەپارێزرێت،
ئەم سورەتە داوای بەخشین بۆ ئەو کەسە دەکات
هەتا لە گوناهەکانی دەبەخشرێت.

Sometimes Allah makes you feel weak and lonely
in order to remind that you will always
be in need of Him and His strength.
Without His assistance, you can do nothing.



هەندێک کات خودا بێهێز و تەنیات دەکات
بۆ ئەوەی بیرت بخاتەوە کە تۆهەمیشە پێویستت
بە خودا و تواناکەیەتی.
بەبێ یارمەتیی ئەو، ناتوانیت هیچ شتێک بکەیت.

Perhaps you are sleeping while tens
of dua are being raised for you.
From a poor person you helped,
or a hungry person you fed,
or a sad person you made happy,
or a person in distress you eased.
Never belittle any good deed.



لەوانەیە تۆ لەخەودا بیت و دەیان دوعات بۆ بەرز ببێتەوە.
لە کەسێکی هەژارەوە کە یارمەتیت داوە،
یان لە کەسێکی برسیبەوە کە خواردنت پێ داوە،
یان کەسێکی خەمبار کە دڵخۆشت کردووە،
یان کەسێک کە لە ناڕەحەتیدا بووە و کارت بۆ ئاسان کردووە.
هەرگیز کاری باشە بە کەم مەزانە.

I ask Allah for one million dollars,
He may not give me, but
may save me from situations that
would cost me one million dollars,
and that's just basics of His hidden blessings.



من داوای یەک ملیۆن دۆلار لە خودا دەکەم،
ڕەنگە پێم نەدات، بەڵام
ڕەنگە لە بارودۆخێک بمپارێزێت کە یەک ملیۆن دۆلاری تێبچێت.
ئەمە تەنها بنچینەی ڕەحمە شاراوەکانیەتی.

Better times will come.
Don't let your waiting period make you sad.
There's divine timing in every situation.
Believe in Allah's mercy.
He will fill your hands with blessings
He has written for you.



کاتی باشتر دێت.
مەهێڵە ماوەی چاوەڕوانییەکەت خەمبارت بکات.
لە هەموو بارودۆخێکدا کاتی پیرۆز هەیە.
باوەڕت بە ڕەحمەت و میهرەبانیی خودا هەبێت.
دەستەکانت پڕ لەو نازو نیعمەتانە دەکات
کە بۆتی نوسیووە.

Do you know why we sometimes
don't get what we want?
Because Allah loves us more than we love ourselves.
We choose. But He chooses better.



ئایا دەزانیت بۆچی هەندێک کات ئەو شتە
بەدەست ناهێنین کە دەمانەوێت؟
لەبەر ئەوەی خودا زیاتر لەخۆمان ئێمەی خۆشدەوێت.
ئێمە هەڵدەبژێرین بەڵام ئەو باشترمان بۆ هەڵدەبژێرێت.

Don't overthink.
It was the qadr of Allah
and it was best for you,
that's all you need to know.
Overthinking is from shaytaan.



زۆر بیر مەکەرەوە.
ئەوە قەدەری خودا بوو
و باشترین شت بوو بۆت،
هەموو ئەوەی کە پێویستە بیزانیت
ئەوەیە کە زۆر بیرکردنەوە لە شەیتانەوەیە.

Another day,
another chance
to right the wrongs of yesterday.
Alhamdulillah.
Alhamdulillah for always giving me
what I needed instead of what I wanted.



ڕۆژێکی تر،
هەلێکی تر
بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی دوێنێ.
سوپاس بۆ خودا.
سوپاس بۆ خودا کە هەمیشە ئەو شتەم پێ دەبەخشێت
کە پێویستمە لەجیاتیی ئەو شتەی کە دەمەوێت.

Don't feel sorry for the blind,
they can't see the haraam that you see.
Don't feel sorry for the deaf,
they can't hear the haraam that you hear.
Don't feel sorry for the mute.
They cannot speak the haraam words that you speak.
Feel sorry for yourself.
You have all of your senses intact yet you are heedless.



بەداخ مەبە بۆ نابیناکان،
ئەوان ئەو حەرامە نابینن کە تۆ دەیبینیت.
بەداخ مەبە بۆ نابیستەکان،
ئەوان ئەو حەرامە نابیستن کە تۆ دەیبیستیت.
بەداخ مەبە بۆ لاڵەکان،
ئەوان ناتوانن قسەی حەرام بکەن کە تۆ دەیکەیت.
بۆ خۆت بەداخ بە،
هەموو هەستەکانت بەتەواوەتی هەیە و هێشتا گەمژەیت.

If they ever ask me
how I have spent the past year I will tell them
"I was looking for Allah".
and if they ever wonder
what I gained out of this journey,
I will answer "finding myself".



ئەگەر ئەوان پرسیارم لێ بکەن
کە چۆنساڵی ڕابردووم بەسەر بردووە، پێیان دەڵێم:
" بە دوای خودادا گەڕام".
گەر بیانەوێت بزانن لەم گەشتە چیم دەست کەوتووە،
وەڵام دەدەمەوە:
"دۆزینەوەی خۆم".

Life is a circle of happiness, sadness,
hard times and good times.
If you are going through hard times,
have faith that good times are on the way.



ژیان بازنەیەکە لە دڵخۆشی، خەمباری،
کاتە دژوارەکان و کاتە باشەکان.
ئەگەر کەوتیتە کاتە دژوارەکانەوە،
باوەڕ و متمانەت هەبێ بەوەی کە کاتە باشەکان بە ڕێگاوەن.

People change so fast.
Yesterday they cared,
today they don't.
Don't waste this dunya
for these people.
Try to achieve Allah's love
and try to achieve Jannah.



خەڵکی زۆر خێرا دەگۆڕێن.
دوێنێ گرنگییان پێ دەدا،
ئەمڕۆ نایدەن.
ئەم دونیایە لەدەست مەدە بۆ ئەم جۆرە کەسانە.
هەوڵبدە خۆشەویستیی خودا بەدەست بهێنە و
هەوڵی بەدەستهێنانی بەهەشت بدە.

Salah is like a sweet addiction,
once you start, you cannot live without it,
it becomes a part of your system.
The fact that Allah makes you addict
to speaking to Him is a blessing itself.



نوێژکردن وەک ئالودەبوونێکی شیرین وایە،
کاتێک دەست پێ دەکەیت، ناتوانیت بەبێ ئەو بژیت.
دەبێتە بەشێک لە سیستمەکەت.
ئەو ڕاستییەی کە خودا ئالودەت دەکات
بۆ قسەکردن لەگەڵی، خۆی بۆ خۆی ڕەحمەتە.

Don't think of the things
you didn't get after praying.
Think of the countless blessings
Allah gave you without asking.



بیر لەو شتانە مەکەرەوە کە لە دوای
نزاکردن بەدەستت نەهێناون.
بیر لەو نیعمەتە بێشومارانە بکەرەوە
کە بەبێ داواکردن خودا پێی بەخشیویت.

Imagine your tongue was made of glass
and every time you spoke a bad word
about someone or something
it cracked a little.
How long before your tongue would shatter
completely?



وای دابنێ کە زمانت لە شوشە دروست بووە و
هەرکاتێک کە قسەیەکی خراپت بەرامبەر کەسێک
یان شتێک کردووە، کەمێکی لێ شکاوە.
ماوەی چەنێک پێش ئێستا زمانت بەتەواوەتی شکابوو؟

Have so much trust in Allah, that
even when something bad does happen,
smile and thank Allah because Allah has
saved you from something far worse than
what has just happened.



زۆر پشت بە خودا ببەستە،
تەنانەت ئەو کاتەش کە شتێکی خراپ ڕوودەدات،
زەردەخەنە بکە و سوپاسی خودا بکە چونکە
خودا تۆی لە شتێکی زۆر خراپتر ڕزگار کردووە
لە چاو ئەو شتەی کە ئێستا ڕوی داوە.

Don't think you're better than someone
because Allah has guided you to the right path.
They may be guided tomorrow while you're
derailed and back to being lost.
Stay humble, always.



وا بیرمەکەرەوە کە تۆ لە کەسێکی تر باشتریت
چونکە خودا ڕێنمونیی کردیت بۆ ڕێگای ڕاست.
لەوانەیە سبەی ئەوان ڕێنمونی بکرێن کاتێک تۆ
لا دەدەیت لە ڕێگای ڕاست و دەگەڕێیتەوە بۆ ونبوون.
هەمیشە بە سادەیی بمێنەرەوە.

Sometimes the best thing you can do
is not think, not wonder, not imagine,
not stress.
Just breathe and have faith in Allah
that everything will work out for the best.



هەندێک جار باشترین شت کە دەتوانیت بیکەیت ئەوەیە
کە بیر نەکەیتەوە، سەرسام نەبیت، خەیاڵ نەکەیت،
پەستانت لەسەر نەبێت.
تەنها هەناسە بدە و ئیمانت بە خودا هەبێت کە
هەموو شتێک بۆ باشترین شت کار دەکات.

When your earning comes from halal source,
even a minimum wage will be sufficient to live a good life,
but when your money comes from haram source,
it will always feel as if it is never enough,
even if you are making millions.



کاتێک داهاتەکەت لە سەرچاوەی حەڵاڵەوە دێت،
تەنانەت ئەگەر ڕێژەیەکی کەمیش بێت بەسە بۆ ژیانێکی باش،
بەڵام کاتێک پارەکانت لە سەرچاوەیەکی حەرامەوە دێت،
هەمیشە وا هەست دەکەیت کە هەرگیز بەس نییە،
تەنانەت ئەگەر ملیۆنان پەیدا بکەیت.

When you find yourself
walking into the wrong way
or getting too comfortable in the dunya,
remember death,
because truly death is
the destroyer of all pleasures.



کاتێک خۆت دەبینیت بە ڕێگایەکی هەڵەدا دەڕۆیت
یان لە دونیادا زۆر ئاسودەیت،
مردنت لەبیر بێت،
چونکە بەڕاستی مردن
وێرانکەری هەموو خۆشییەکانە.

Your strength doesn't come from winning.
It comes from your struggles and hardship.
That's why the more He loves you,
the more He tests you!



هێز و توانای تۆ لە بردنەوەکانتەوە نایەت
لە تێکۆشان و ناڕەحەتیەکانتەوەیە.
لەبەرئەوەیە تا زیاتر خۆشی بوێیت،
زیاتر تاقیت دەکاتەوە!

No one in this world is pure and perfect.
If you avoid people for their mistakes
you will always be alone.
So judge less and love more.



هیچ کەسێک لەم دونیایەدا پاک و بێکەموکورتی نییە،
گەر خۆت لە هەموو کەسێک دوربخەیتەوە لەبەر هەڵەکانیان،
ئەوا هەمیشە بە تەنیا دەمێنیتەوە.
لەبەر ئەوە کەمتر بڕیار بدە و زیاتر خۆشت بوێن.

Allah tells us in the Quran,
"Call upon me, I will respond to you".
So what makes you think He's not listening to you?
He heard you before the words even came out of your mouth.
That is the beauty of Allah, we don't even have to say anything and He already knows.



خودا لە قورئاندا پێمان دەفەرموێت،
"بانگم بکەن، وەڵامتان دەدەمەوە"
کەواتە چی وات لێ دەکات کە پێت وایە گوێت لێ ناگرێت؟
ئەو گوێی لە تۆیە تەنانەت کاتێک وشەکە لە دەمت نەهاتووەتە دەرەوە.
ئەوە جوانیی خودای گەورەیە،
تەنانەت پێویست ناکات هیچ شتێک بڵێین ئەو پێش ئەوە دەیزانێت.

## Learn that

every blossom upon this earth can be replaced,
but never the earth itself.
Learn that Allah does not need us in His garden,
but we need Him to grow.



**فێربە کە**

هەموو چرۆیەک لەسەر ئەم زەوییە دەکرێت جێی بگیرێتەوە.
بەڵام هەرگیز زەوی خۆی نا.
فێر بە کە خودا لە باخچەکەی خۆیدا پێویستی بە ئێمە نییە.
بەڵام ئێمە پێویستمان بە ئەوە بۆ ئەوەی گەشە بکەین.

Wasting time is worse than death.
Because death separates you from this world
whereas wasting time separates you from Allah.



کاتبەغیڕۆدان لە مردن خراپترە،
لەبەر ئەوەی مردن لەم جیهانەت دادەبڕێت،
بەڵام کاتبەفیڕۆدان لە خودات دادەبڕێت.

The state of the slave in the grave is like
the state of the heart in the chest.
If you want to know what your state
will be in the grave, look at the state
of your heart in your chest.



بارودۆخی بەندەکان لە قەبردا هەر وەکو
بارودۆخی دڵ وایە لە سنگدا.
ئەگەر دەتەوێت بزانیت بارودۆخت چۆنە لەناو قەبردا،
ئەوا سەیری بارودۆخی دڵت بکە لەناو سنگتدا.

Allah knows what your silent heart wants.
Even if you don't include it in your prayers.
He hears what your heart whispers.
Just believe that things will happen in the
best possible way.



خودا دەزانێت دڵی بێدەنگت چی دەوێت.
تەنانەت ئەگەر لە نزاکانتدا باسی نەکەیت.
ئەو دەبیستێت کە دڵت چی دەچرپێنێت.
تەنها بڕوا بەوە بکە کە شتەکان بە باشترین
شێوە لە کاتی گونجاودا ڕوودەدەن.

Do not steal the happiness of anyone,
and do not trouble the heart of anyone.
Our lives are short, and in our graves we
will be in need of those who pray for
us and not against us.



دڵخۆشیی کەس مەبە،
دڵی کەس مەنیشێنە.
ژیانمان کورتە و لە گۆڕەکانماندا
پێویستمان بەو کەسانە دەبێت
کە نزامان بۆ دەکەن و نزامان لێ ناکەن.

Surah Yusuf is so beautiful.
It teaches us the closest people can betray you,
broken hearts can be healed with love,
ease comes after hardship,
being sad doesn't equal being ungrateful,
and people of patience have beautiful endings.



سورەتی یوسف زۆر جوانە.
فێرمان دەکات دەکرێت نزیکترین کەسمان خیانەتمان لێ بکات،
دەکرێت دڵە شکاوەکان بە خۆشەویستی چاک ببنەوە،
خۆشی دوای سەختی دێت،
غەمگینبوون یەکسان نییە بە ناسوپاسگوزاری،
کەسانی ئارامگر کۆتاییەکی جوانیان هەیە.

Allah sometimes takes us into troubled waters,
not to drown us, but to cleanse us.
Allah has set the perfect time for
each and every event in your life.
Just do your best and leave the rest to Allah.



خودا هەندێک جار دەمانباتە ناو ئاوی تەنگەبەرەوە،
نەک بۆ خنکاندنمان، بەڵکوو بۆ ئەوەی پاکمان بکاتەوە.
خودا کاتێکی دروستی داناوە بۆ هەموو ڕووداوێک لە ژیانتدا.
تەنها باشترین هەوڵی خۆت بدە و ئەوانی تر بۆ خودا بەجێ بهێڵە.

Even if you haven't prayed your Salah in weeks, months or even years.
Turn back to Allah today.
Allah will still forgive you and love you for doing the right thing.



تەنانەت ئەگەر هەفتەیەکە، مانگێکە
یاخود ساڵانێکە نوێژەکانت نەکردووە
ئەمڕۆ بگەڕێرەوە بۆ لای خودا.
خودا هێشتا لە تۆ خۆش دەبێت و
خۆشی دەوێیت بۆ کردنی کارە ڕاستەکە.

Why are you stressing yourself with this momentary life?
Why are you working so hard to gain temporary pleasure?
The life of this world is just a disaster,
while permanent and eternal happiness
is to be found in the hereafter.



بۆچی خۆت توشی بەستان و ناڕەحەتی دەکەیت بۆ ئەم ژیانە کاتییە؟
بۆچی ئەوەندە بە قورسی کاردەکەیت بۆ بەدەستهێنانی چێژێکی کاتی؟
ژیانی ناو ئەم جیهانە جگە لە کارەسات هیچی تر نییە،
لە کاتێکدا بەختەوەریی هەمیشەیی و ئەبڕاوە لە بەهەشتدا دەدۆزیتەوە.

Pray until your situation changes.
Miracles happen everyday,
so never stop believing.
Allah can change things very quickly in your life.



نزا بکە هەتا بارودۆخت دەگۆڕێت.
هەموو ڕۆژێک موعجیزەکان ڕوو دەدەن،
بۆیە هەرگیز واز لە باوەڕبوون بە خودا مەهێنە.
خودا دەتوانێت زۆر بەخێرایی شتەکان لە ژیانتدا بگۆڕێت.

This worldly life is like a shadow.
If you try to catch it. You will never be
able to do so.
If you turn your back towards it.
It has no choice but to follow you.



ئەم ژیانە دونیاییە وەک سێبەر وایە،
ئەگەر بتەوێت بیگریت، هەرگیز توانای ئەوەت نابێت.
ئەگەر پشتی لێ بکەیت، هیچ هەڵبژاردنێکی تری نییە
جگە لە شوێنکەوتنت.

I think the best thing you can do for yourself
is stop comparing your qadr and rizq with
anyone elses.
We will all get our portion of this dunya,
there`s no point in being sad about the things
you do not have.
Just strive to better yourselves and
focus on being content with what
Allah has decreed for you.



وابزانم باشترین شت کە دەتوانیت بۆ خۆت بیکەیت
ئەوەیە بوەستیت لە بەراوردکردنی قەدەر و ڕزقەکەت لەگەڵ کەسانی تر.
ئێمە هەمووومان بەشی خۆمان لەم دونیایە وەردەگرین،
هیچ خاڵێک نییە بۆ خەمباربوون لەو شتانەی کە تۆ نیتە.
تەنها هەوڵ بدەن خۆتان باشتر بکەن و سەرنج بدەن
لەسەر ئەوەی کە خودا بڕیاری داوە بۆتان.

Whoever does good,
must know that it is Allah,
who allowed him to do so,
and whoever is protected from evil,
must know that it is Allah,
who protected him.



ئەوەی چاکە بکات،
دەبێت بزانێت ئەوە خودایە کە ڕێگەی
بۆ داوە چاکە بکات،
ئەوەی لە خراپە پارێزراوە،
دەبێت بزانێت ئەوە خودایە
کە پارێزگاریی لێ کردووە.

All the events that we think
are taking us away from our dreams
may bring us closer to them in a way
other than what we see.
They are Allah's measures that we do not realize.



هەموو ئەو ڕوداوانەی کە پێمان وایە
لە خەونەکانمان دوور دەخەنەوە
لەوانەیە نزیکترمان بکەنەوە لە ڕێگایەکی ترەوە
جیا لەو ڕێگایەی کە ئێمە دەیبینین.
ئەوانە پێوەرەکانی خودان کە ئێمە درکیان پێ ناکەین.

You will meet Him. We all will.
And when you do, the pain will be gone.
These moments will be small.
But what you gained will be big.
It will be big.
The broken of this life will be kings and queens then.
Your pain will have become just another jewel in your crown.



تۆ چاوت پێی دەکەوێت. هەمووومان چاومان پێی دەکەوێت.
وە کاتێک کە دەیبینیت، ئازارەکە نامێنێت.
ئەم ساتانە بچووکن
بەڵام ئەوەی بە دەستی دەهێنیت گەورە دەبێت.
گەورە دەبێت.
ئەو دەمە شکاوییەکانی ئەم ژیانە دەبنە پاشا و شاژن.
ئازارەکەت دەبێتە گەوهەرێکی تر لە تاجەکەتدا.

If anyone constantly seeks pardon from Allah,
Allah will appoint for him a way out of every
distress
and a relief from every anxiety,
and will provide sustenance for him from where
he expects not.



ئەگەر کەسێک بەردەوام داوای لێ بوردن لە خودا بکات،
ئەوە خودای گەورە ڕێگایەکی بۆ دیاری دەکات دوور
لە هەموو تەنگایەک و حەساوە لە هەموو مەراقێک، وە
ڕزق و ڕۆزییەکی پێ دەبەخشێت لە شوێنێکەوە
کە خۆیشی چاوەڕوانیی شتی وا نەکات.

You are worried He didn't hear you.
You think He's not going to answer you.
And the entire time He's been planning it perfectly for you.
Think good of Allah.



تۆ نیگەرانیت کە گوێی لە تۆ نەبوو.
وا بیر دەکەیتەوە کە وەڵامت ناداتەوە.
هەموو کات ئەو بە بێکەموکوڕی پلان بۆ تۆ دادەنێت.
بە باشە بیر لە خودا بکەرەوە.

Whatever happens in your life,
no matter how troubling things might seem,
do not enter the neighborhood of despair.
Even when all doors remain closed,
Allah will open up a new path, only for you.
Be thankful.



هەر شتێک کە لە ژیانتدا ڕوو بدات،
گرنگ نییە کە شتەکان چەن بێزارکەر دەردەکەون،
نەچنە ناو گەڕەکی نا ئومێدی.
تەنانەت کاتێک کە هەموو دەرگاکان داخراون،
خودا ڕێڕەوێکی نوێ دەکاتەوە، تەنها بۆ تۆ.
سوپاسگوزار بە.

Allah does not forget the good you do,
nor does He forget the good you did to others
and the pain you relieved them from.
Nor will He forget the eye which was
about to cry but you made it laugh.



ئەو چاکەیەی کە دەیکەیت خودا لەبیری ناکات،
ئەو چاکەیەش لەبیر ناکات لەگەڵ ئەوانی تردا کردت،
وە ئەو ئازارەی کە لات بردووە لەسەریان.
ئەوە لەبیر ناکات خەریک بوو دەگریان
بەڵام تۆ گریانەکەیانت کرد بە پێکەنین.

The purpose of the test is not to see
what you can do on your own.
The purpose of the test is to see
how much you can trust the One
who never leaves you on your own.



مەبەست لە تاقیکردنەوەکە ئەوە نییە
کە بزانیت خۆت بە تەنها دەتوانیت چی بکەیت.
مەبەست لە تاقیکردنەوەکە ئەوەیە کە بزانیت
تاچەند دەتوانیت متمانە بەو کەسە بکەیت کە
هەرگیز بە تەنیا بەجێت ناهێڵێت.

If Allah gave us all of our blessings at once,
we wouldn't be able to truly appreciate them.
Good things take time.
Have sabr and tawakkul in Allah's plan for you.
Let your soul rest and find peace in knowing
that everything will happen in His perfect timing.



ئەگەر خودا هەموو خێر و بەرەکەتێکمان بە یەکجار پێ ببەخشێت،
ئەو کاتە ناتوانین بەتەواوەتی قەدریان بزانین.
شتە باشەکان کاتیان دەوێت.
سەبر و باوەڕت هەبێت بە پلانەکانی خودا کە بۆتی داناوە.
با ڕۆحت ئاسودە بێ و ئارامی بدۆزێتەوە بە زانینی
ئەوەی هەموو شتێک لە باشترین کاتی خۆیدا ڕوودەدات.

If you want to know where you stand
with the love of Allah compared to others,
look at the love of the Quran in your heart
and your pleasure in listening to it.
It is well known that whoever loves someone,
his words and conversation are the most beloved
thing to him.



ئەگەر دەتەوێت بزانیت لە چی ئاستێکدایت بەراورد
بە کەسانی تر لە خۆشەویستیی خودادا،
سەیری خۆشەویستیی قورئان و چێژی گوێگرتن لێی لە دڵتدا بکە.
ئەوە باش زانراوە کە کەسێک کەسێکی تری خۆش بوێت
قسە و گفتوگۆکانی خۆشەویسترین شتن بۆ ئەو.

Those who love each other for Allah's Sake,
when they smile at each other,
their sins fall from each other,
just as the leaves fall from a tree before the winter.



ئەوانەی کە لە پێناو خودادا یەکتریان خۆش دەوێت،
کاتێک زەردەخەنە بۆ یەکتری دەکەن،
گوناهەکانیان هەڵدەوەرێت،
هەر وەک هەڵوەرینی گەڵاکانی درەختێک پێش هاتنی زستان.

The souls that returned back to their Lord last night.
Thought they would wake up tomorrow.
We are the blessed ones.
Who were given another chance to be better.
Nobody is promised time.
Turn back to Him now.



ئەو ڕۆحانەی دوێنێ شەو گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاریان.
پێیان وابوو کە سبەی بەخەبەر دێنەوە.
ئێمە ڕەحمپێکراوەکانین.
کە هەلێکی ترمان پێ دراوە بۆ ئەوەی باشتر بین.
بەڵێنی کات بە هیچ کەسێک نەدراوە.
ئێستا بگەڕێرەوە بۆ لای.

Allah loves you more than you can imagine.
He sees the good in you, even when you can't see the good in yourself. So go back to Him because He will always be there.



خودا تۆی خۆش دەوێت زیاتر لەوەی کە دەتوانیت وێنای بکەیت.
ئەو چاکە لە تۆدا دەبینێت، تەنانەت خۆت ناتوانیت ئەو چاکەیە لە خۆتدا ببینیت. لەبەر ئەوە بگەڕێرەوە بۆلای، ئەو هەمیشە لەوێیە.

Let every single one of us know that, there will come a day where we wish that our book of deeds had one extra good deed or one less sin, and that day is not far away at all.



با هەر یەکێک لە ئێمە بزانێت کە ڕۆژێک دێت،
کە هەر یەکێک لە ئێمە خۆزگە دەخوازێت کە
کتێبی کردەوەکانمان یەک کردەوەی زیاتری باشەی
تێدا بێت یان گوناهێک کەمتری تێدا بێت،
وە ئەو ڕۆژەش بە هیچ شێوەیەک دوور نییە.

Allah will grant you everything you need
when He thinks you're ready to receive it.
You will receive what is written for you when
Allah will trust His timings and plans.



خودا هەموو شتێکت پێ دەبەخشێت کە پێویستتە
کاتێک کە بزانێت تۆ نامادەیت بۆ وەرگرتنی.
هەموو نەو شتانە بەدەست دەهێنیت کە بۆت نوسراون
کاتێک خودا باوەڕی بە کات و پلانەکانیەتی.

Keep telling Allah what your heart wants most. Keep talking to Him. Keep believing that what you are asking is something only Allah can give. And He will give it to you. You just have to believe it.



بەردەوام بە خودا بڵێ کە دڵت چی شتێکی دەوێت.
بەردەوام قسەی لەگەڵ بکە. باوەڕت بەوە هەبێت کە
هەر شتێک دەتەوێت تەنها خودا دەتوانێت پێت ببەخشێت.
ئەو پێت دەبەخشێت، تۆ تەنها دەبێت باوەڕت پێی هەبێت.

The pain in your heart in known by Allah,
The tears in your eyes are seen by Allah,
The duas on your lips are heard by Allah,
Trust that a miraculous breakthrough is
coming to you from Allah.



ئەو ئازارەی لە دڵتایە خودا پێی دەزانێت،
فرمێسکەکانی چاوت لە لایەن خوداوە دەبینرێن،
دوعاکانی سەر لێوت لە لایەن خوداوە دەبیسترێن،
بڕواتان بە خودا هەبێت کە گۆڕانێکی موعجیزەئاسایتان
لە لایەن خوداوە بۆ دێت.

I reached a point in my life where I am
satisfied with anything that happens
out of my control.
Allah knows what's the best for me.
Even if I don't feel good at the moment,
I am sure that it all happened for a reason.



من گەیشتمە خاڵێک لە ژیانمدا کە
ڕازیم بە هەرشتێک لە سەروو کۆنترۆڵی خۆمەوە ڕوو بدات.
خودا دەزانێت چی باشترینە بۆ من.
تەنانەت ئەگەر لە ئێستادا هەستێکی باشم نەبێت،
دڵنیام کە هەمووی لەبەر هۆکارێک ڕووی داوە.

Everything ends. Hard times will end.
Depression will end. Bad days will end.
The feelings of all the breakdowns will end.
it's just a matter of time,
and everything will be okay again.



هەموو شتێک کۆتایی دێت، کاتە سەختەکان کۆتاییان دێت،
خەم و خەفەت کۆتایی دێت. ڕۆژە ناخۆشەکان کۆتاییان دێت.
هەموو هەستە تێکشکاوەکان کۆتاییان دێت،
تەنها لەسەر کات وەستاوە و
هەموو شتێک دووبارە باش دەبێت.



How do you expect to be protected?
If you're not willing to sacrifice any of your time
for the sake of the Protector?



چۆن چاوەڕێ دەکەیت پارێزراو بیت؟
گەر ئامادە نەبیت کاتی خۆت لەپێناو پارێزەرەکەتدا
بکەیت بە قوربانی؟

The life of this world is made up of three days:
Yesterday has gone with all that was done,
Tomorrow, you may never reach; but today
is for you so do what you should do today.



زیانی ئەم جیهانە لە سێ ڕۆژ دروست بوو:
دوێنێ لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا ڕۆشتووە کە ئەنجام دراون،
سبەینێ لەوانەیە هەرگیز پێی نەگەیت؛ بەڵام ئەمڕۆ
بۆ تۆیە هەربۆیە ئەوە بکە کە دەبێت ئەمڕۆ بیکەیت.

This is life.
whether you like it or not,
you will not grow without pain,
you will not learn without making
mistakes first, and you will not succeed
without experiencing failure.



ئەمە ژیانە،
گەر حەزت لێیەتی یان نا،
بە بێ ئازار گەورە نابیت،
بە بێ هەڵەکردن فێرنابیت و
بە بێ ئەزموونەکردنی شکست، سەرناکەویت.

The greatest lesson you can teach yourself
is to be patient.
Be patient when you're happy
because happiness ends,
and be patient when you're sad,
because sadness too ends.
Nothing is constant. Everything is temporary,
except Allah. The Eternal, The Everlasting.



گەورەترین وانەیەک کە دەتوانیت خۆت فێر
بکەیت ئەوەیە کە ئارام بیت.
ئارام بە کاتێک دڵخۆشیت، چونکە دڵخۆشی کۆتایی دێت،
ئارام بە کاتێک خەمباریت، چونکە خەم و بەژارەش کۆتایی دێت.
هیچ شتێک نەگۆڕ نییە. هەموو شتێک کاتییە،
جگە لە خودا، نەمر و هەمیشەیی.

Allah has perfect plans for you.
Put your trust in Allah and have patience.
When Allah tests you, it is never intended to destroy you.
When He removes something in your possession, it is only in order to empty your hands for an even greater gift.



خودا پلانێکی بێکەموکەڕی بۆ داناویت.
باوەڕت بە خودا هەبێت و ئارام بگرە.
کاتێک خودا تاقیت دەکاتەوە، هەرگیز نایەوێت وێرانت بکات.
کاتێک شتێک لە ماڵەکەت لادەبات.
تەنها لەبەر ئەوەیە دەستەکانت خاڵی بکات
بۆ وەرگرتنی خەڵاتێکی گەورەتر.

# Don't be sad,

pain in this dunya is temporary,
handle it with sabr and In Shaa Allah
a greater reward a waits you,
Allah is with the patient.



**خەمبار مەبە،**

ئازار لەم دونیایەدا کاتییە،
سەبر بگرە و پشت بە خودا
پاداشتێکی گەورەتر چاوەڕوانت دەکات.
خودا لەگەڵ ئارامگراندایە.

What Allah has written for you,
will always greater than your wishes.
Patience will show you with so
much clarity.



ئەوەی کە خودا بۆی نوسیویت،
هەمیشە گەورەترە لە خۆزگە و حەزەکانی خۆت.
ئارامگرتن زۆر بەڕوونی پیشانت دەدات.

Whenever you are being tested with hardships,
tell yourself
that your good deeds weren't enough for you
to earn the rank of Jannah
that Allah wants for you.
Now stay calm during the trial
so that you may be rewarded
for the sabr you're observing.



هەرکاتێک بە تەنگانە و ناڕەحەتی تاقی کرایتەوە،
بە خۆت بڵێ
کە کردەوە باشەکانت بەس نەبوون بۆ
بەدەستهێنانی پلەیەکی بەهەشت
کە خودا بۆ تۆی دەوێت.
ئێستا بە درێژایی تاقیکردنەوەکە ئارام بگرە
بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو سەبرە بدرێیتەوە
کە چاوەڕێی دەکەیت.

Not everyone will have the heart you have,
not everyone will appreciate you
and what you do for them,
sometimes it won't be easy having
a kind heart in this cruel world.
for Allah, be patient!



هەموو کەس ئەو دڵەی نابێت کە تۆ هەتە،
هەموو کەس قەدری تۆ و
ئەو شتانە نازانێت کە بۆیان دەکەیت،
هەندێک جار بوونی دڵێکی میهرەبان
لەم جیهانە دڵڕەقانەدا ئاسان نابێت.
لەبەر خودا، ئارام بگرە!

Sabr is tiring,
sabr isn't easy,
sabr leaves you on the edge,
but Allah says,
"I do not burden a soul beyond that it can bear".



سەبر ماندووکەرە،
سەبر ئاسان نییە،
سەبر لەسەر لێوارەکە جێت دەهێڵێت،
بەڵام خودا دەفەرموێت،
"من بارگرانی ناخەمە سەر ڕۆحێک کە نەتوانێت هەڵیگرێت".

When the Prophet( PBUH) says:
"Be patient" remember this advice
comes from one who lost both parents and
buried six children during his life.



کاتێک پێغەمبەر(درودی خودای لێ بێت)دەفەرموێت:
"ئارام بە" ئەم ئامۆژگارییەت لەبیر بێت
لە کەسێکەوە هاتووە کە بە درێژایی ژیانی هەردوو دایک و باوکی
لە دەست داوە و شەش منداڵی بە خاک سپاردووە.

If you have sabr
nothing can destroy you,
Allah is on your side.



ئەگەر سەبرت هەبێت
هیچ شتێک ناتوانێت تێکت بشکێنێت،
خودا لەگەڵ تۆدایە.

# Sabr!

Because Allah's timing is always worth the wait.



## سەبر بگرە!

لەبەر ئەوەی کاتدانانی خودا هەمیشە شایەنی چاوەڕوانییە.

A moment of patience in a moment of anger
saves you a hundred moments of regret.
The prophet(PBUH) said:
"Do not become angry and paradise will be yours"



ساتێک ئارامی لەناو ساتێک تورەیدا
لە سەدان ساتی پەشیمانی دەتگەڕێنێتەوە.
پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی:
"تورە مەبە و بەهەشت بەدەست دەهێنیت".

Having sabr doesn't mean you're not
allowed to have emotions.
Sabr means that even with all the anger,
even with all the sadness,
even with the nights you cried your eyes out,
you still were grateful to Allah.
You still turned to Him and trusted His plan.

هەبوونی سەبر مانای ئەوە نییە کە
تۆ ڕێگەت پێ نەدراوە هەستت هەبێت.
سەبر بەو مانایە دێت کە تەنانەت بە هەموو تووڕەییەکانیشەوە،
تەنانەت ئەو شەوانەی زۆر دەگریایت
هێشتا سوپاسگوزاریی خودای گەورە بوویت،
تۆ هێشتا ڕووت تێ دەکرد و باوەڕت بە پلانەکانی هەبوو.

Allah can instantly give you
what your heart desires.
He will unfold the plan He has written
for you and it will be more beautiful
than your expectations.
So bear a little more.
His plan is worth waiting for.



خودا دەتوانێت دەستبەجێ ئەو شتانەت بێ ببەخشێت
کە دڵت ئارەزووی دەکات.
ئەو پلانەی بۆتی نوسیوە ئاشکرا دەکات
جوانتر دەبێت لەچاو چاوەڕوانییەکانی تۆدا.
کەواتە کەمێک زیاتر چاوەڕوان بە.
پلانەکەی شایەنی چاوەڕوانییە.

Sometimes sabr and silence is better than
expressing how you really feel.



هەندێک کات سەبر و بێدەنگی باشترە
لە دەربڕینی ئەوەی کە هەستت چۆنە.

Always remember
to ask for forgiveness,
and always remember
to correct your mistakes.
You have plenty of time and chances,
which you take for granted.
But once it's all over a last chance will be
what you beg Allah for on the Day of Judgment.



هەمیشە لەبیرت بێت
داوای بەخشین بکەیت،
وە هەمیشە لەبیرت بێت
کە هەڵەکانت ڕاست بکەیتەوە،
تۆ کات و هەلێکی زۆرت هەیە،
بەڵام کاتێک هەمووی کۆتایی هات
کۆتا هەلی ئەوە دەبێت کە لە ڕۆژی دواییدا
داوای چی لە خودا دەکەیت.

# Dear girl,

Love is not finding a smart guy
and start thinking him as your love.
Don't waste your feelings on
such false stuff.
Be loyal to your parents.
You are respected daughter
and future wife of someone.
Haraam relations usually
don't have halal endings.



# کچی ئازیز،

خۆشەویستی ئەوە نییە کوڕێکی ڤۆز بدۆزیتەوە
دەست بکەیت بە بیرکردنەوە لێی وەک خۆشەویست.
هەستەکانی خۆت لەم شتە بڕوپوچانەدا بەفیڕۆ مەدە.
دڵسۆز بە لەگەڵ دایک و باوکتدا.
تۆ کچێکی ڕێزلێگیراو و هاوسەری کەسێکیت لە داهاتوودا.
پەیوەندیی حەرام زۆرکات کۆتاییی حەڵاڵی نییە.

Be someone who fears Allah
in public and in private,
because then you are indeed successful
in this world and the hereafter.



کەسێک بە کە بەئاشکرا و نهێنی لە خودا بترسێت،
چونکە بەڕاستی ئێوە لە دونیا و
قیامەتدا سەرکەوتوو دەبن.

Haram relationship doesn't
become Halal even your boyfriend
wakes you up for fajr.



پەیوەندیی حەرام نابێتە حەڵاڵ
حەتا ئەگەر هاوڕێ کوڕەکەت
بۆ نوێژی بەیانی خەبەرت بکاتەوە.

You might not be struggling
with the acts of worship themselves,
but if your akhlaq is poor,
you'll be portraying Islam in a negative manner.



لەوانەیە هیچ کێشە و بەربەستێکت نەبێت
لە کردنی خودی عیبادەتەکانتدا، بەڵام
ئەگەر ڕەوشتت جوان نەبێت،
ئەوا وێنایەکی ناشرینی ئیسلام پیشانی دەوروبەر دەدەیت.

Everything around you will be gone
one day.
The only thing that matter is what
you did for Allah.



ڕۆژێک دێت هەموو شتەکانی چواردەورت
نامێنن،
تاکە شتێک کە گرنگ بێت ئەوەیە کە
چیت ئەنجام داوە بۆ خودا.

Every morning. We get a chance
to be different.
A chance to change.
A chance to be better.
Your past is your past. Leave it there.
Get on with the future part.



هەموو بەیانییەک، دەرفەتێکمان هەیە
بۆ ئەوەی جیاواز بین.
دەرفەتێک بۆ گۆڕان.
دەرفەتێک بۆ باشتربوون.
ڕابردووت کۆتایی هاتووە. وازی لێ بهێنە.
سەرقاڵی داهاتووت بە.

No matter how far you have traveled in
the wrong direction,
Turn to Allah.
He is ready to accept you.



گرنگ نییە کە تا مەودایەکی چەند دوور
بە ناڕاستەیەکی هەڵەدا گەشتت کردووە.
بگەڕێرەوە بۆ لای خودا.

Don't compare your love story
to those you watch in movies and web series.
They are written by scriptwriters
and yours is written by Allah.



چیرۆکی خۆشەویستیی خۆت بەو کەسانە بەراورد مەکە
کە لە فیلم و وێبسایتەکان دەیان بینیت.
هیی ئەوان لە لایەن دەقنووسەکانەوە نووسراون و
هیی تۆ لە لایەن خوداوە.

Don't hang around
behind a door of the dunya
which will not open,
instead realize a door of Jannah
has opened for you.



کات بەفیڕۆ مەدە لە پشت دەرگایەکی دونیا
کە بە ڕووتدا ناکرێتەوە،
لەجیاتی ئەوە، درک بەوە بکە کە دەرگایەکی
بەهەشت بە ڕووتدا کراوەتەوە.

If you want to cry,
cry in front of Allah,
not in front of others.
remember,
only Allah can help you.



ئەگەر دەتەویت بگریت
لەبەردەم خودا بگری،
نەک لەبەردەم خەڵک.
لەبیرت بیت،
تەنها خودا دەتوانیت یارمەتیت بدات.

Don't misuse youth
with fake promises
and empty words.
Wait for the one
whose words are reminders of your akhirah
as much as his own.
If he doesn't care for his own,
then why would he care for yours?



گەنجییەتیت بە بەڵێنی ساختە و
وشەی پڕوپوچ بەسەر مەبە.
چاوەڕێی ئەو کەسە بکە کە وشەکانی بەقەد
خۆی ڕۆژی دوابیت بیر دەهێنێتەوە.
ئەگەر گوێ بە هی خۆی نەدات،
چۆن گوێ بەوەی تۆ دەدات؟

Some things are just more beautiful
once they are permissible for you.
Notice how miserable it is
To hide the person you love from your parents,
or to hide the commitment of major sins
from people.
Be patient with what you want
because true satisfaction comes with things,
we have been patient for.



هەندێک شت جوانترن
کاتێک تەنیا بۆ تۆ ڕێپێدراون.
ببینە چەند ناخۆشە کاتێک ئەو کەسەی خۆشت دەوێت
لە دایک و باوکتی بشاریتەوە،
یاخود شاردنەوەی کردنی گوناهێکی گەورە لە خەڵکی.
ئارام بە لەگەڵ ئەو شتەی کە دەتەوێت
چونکە دڵخۆشیی ڕاستەقینە لەو شتانەدایە
کە بۆ بەدەستهێنانیان ئاراممان گرتووە.

Marrying someone good is one thing
and marrying into a good family is another.
I pray Allah gives you both.



هاوسەرگیریکردن لەگەڵ کەسێکی باش شتێکە
و ڕۆیشتنە ناو خێزانێکی باش شتێکی ترە.
دەپاڕێمەوە لە خوا
هەردووکیانت بۆ ببەخشێت.

## Dear girl,

You will never find the right person,
if you never let go of wrong one.



## کچی نازیز،

هەرگیز کەسە ڕاستییەکە نادۆزیتەوە.
ئەگەر هەرگیز نەهێڵیت کەسە هەڵەکە بڕوات.

# Dear girl,

Don't lose that person who
loved you during your hard times,
because not everyone will love you
when you are at your worst.



# کچی ئازیز،

هەرگیز ئەو کەسە لەدەست مەدە
کە بەدرێژایی کاتە سەختەکان تۆی خۆشویستووە،
لەبەر ئەوەی هەموو کەسێک تۆی خۆش ناوێت
کاتێک لە خراپترین کاتتایت.

Be aware of selling your deen for validation
and never compromise it for a little enjoyment.
Your deen has so much value
that nothing in the dunya is comparable in worth.



ئاگادار بە دینەکەت بۆ ڕەزامەندیی کەسانی تر نەفرۆشیت
هەرگیز دینەکەت بۆ کەمێک خۆشیبینین نەگۆڕیتەوە.
دینەکەت زۆر بەبەهایە
کە ناکرێت لەگەڵ هیچ شتێک لە دونیادا بەراورد بکرێت.

Marry a person who is rich in deen,
not in money. Money comes and goes,
but a person who has fear of Allah will try
their best to treat and respect you
the way you deserve to be treated.



هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێک بکە کە دەوڵەمەندە بە دین،
نەک بە پارە. پارە دێت و دەڕوات،
بەڵام کەسێک کە لە خودا بترسێت هەموو هەوڵێکی خۆی دەدات
بۆ مامەڵەکردن و ڕێزگرتن لە تۆ
بەو شێوەیەی کە شایستەیت لێت بکرێت.

Even the most trusted person could lie.
Even the best friend could change.
Even the sweetest man could cheat.
Even the strongest friendship could ruin.
Even the person you love could gone.
Sad to think, hard to accept, but this is reality.



تەنانەت باوەڕپێکراوترین کەس دەشێت درۆ بکات.
دەشێت باشترین هاوڕێت بگۆڕێت لەگەڵت.
دەشێت ڕاستگۆترین پیاو خیانەت بکات.
بەهێزترین پەیوەندی تێک بشکێت و ویران بێت.
دەشێت ئەو کەسەی کە زۆرت خۆش ئەوێت بڕوات و جێت بهێڵێت.
جێگەی دڵتەنگییە کە بیر لەمانە بکەیتەوە و قورسە قبوڵی بکەیت.
بەڵام ئەمانە هەمووی حەقیقەتن.

Choose the things Allah loves above
your own wishes,
for He knows what's best for you.



ئەو شتانە هەڵبژێرە کە خودا خۆشی دەوێت
لە سەرووی ئەو شتانەی کە داوای دەکەیت،
چونکە ئەو دەزانێت چی باشترینە بۆ تۆ.

Do not sell your haya
for a portion of this dunya.
This worldly life is nothing
but a delusion and its enjoyment will not last long.
Strive but do not lose sight of your final
destination,
which is nothing but the everlasting Jannah.



حەیاکەت مەفرۆشە بۆ بەشێک لەم دونیایە،
ئەم ژیانە دونیایە جگە لە وەهمێک هیچی تر نییە،
چێژی تا سەر نامێنێتەوە.
هەوڵ بدە، بەڵام شوێنی کۆتا مەبەستی خۆت لەدەست مەدە،
کە هیچ نییە بەڵام بەهەشت نەبڕاوەیە.

Beware of showing piety on your face
when you do not feel it in your heart.



ئاگادار بە لە پیشاندانی خوداناسی لە ڕوخسارتدا
کاتێک کە لە دڵتدا هەستی پێ ناکەیت.

Don't wait to get old to worship Allah.
If today is your last day, you are old already.



چاوەڕێ مەبە پیر ببیت بۆ ئەوەی خودا پەرستی بکەیت،
ئەگەر ئەمڕۆ کۆتا ڕۆژی تۆ بێت، ئەوا تۆ پێشتر پیر بوویت.

## Dear girl,

Even though a man is responsible for his gaze, you are responsible for what you give him to gaze at...

So guard your modesty.



## کچی ئازیز،

هەرچەندە پیاو بەرپرسیارە لە نەزەرکردنت،

تۆش بەرپرسیاریت لەوەی کە چی پێ دەدەیت بۆ نەزەر لێ کردنت...

لەبەر ئەوە پارێزگاری لە ڕێکپۆشیی خۆت بکە.

## Dear girl,

You are a daughter of a respected man.
don't let young boys fool you into their temporary lust.
Know your worth.



## کچی نازیز،

تۆ کچی پیاوێکی بەڕێزیت.
مەهێڵە کوڕە گەنجەکان هەڵت بخەڵەتێنن بۆ شەهوەتێکی کاتیی خۆیان.
بەهای خۆت بزانە.

The only return
that leads you forward
is to return to Allah.



تەنها گەڕانەوەیەک
کە بەرەو پێشەوەت دەبات
گەڕانەوەیە بۆ لای خودا.

People will ignore a thousand good deeds
because of one fault,
Allah will ignore a thousand faults
because of one good deed.



مرۆڤەکان بە هەڵەیەک چەندین چاکەت لەبیر دەکەن،
خودای گەورەش بە چاکەیەک لە چەندین هەڵەت دەبوورێت،

The beauty of the Quran is that
you cannot change its message,
but its message can change you.



جوانیی قورئان لەوەدایە کە ناتوانیت
پەیامەکەی بگۆڕیت، بەڵام
پەیامەکەی دەتوانێت تۆ بگۆڕێت.

Rely on nothing and no one except Allah.



جگە لە خودا پشت بە هیچ شتێک و هیچ کەسێک مەبەستە.

Allah will change your situation
in a way that you didn't even imagine.



خوا بە جۆرێک بارودۆخت دەگۆڕێت
تەنانەت بە خەیاڵیشتدا نەهاتووە.

## Allah

Who gives without even asking
will surely give when we ask Him.



## خودا

دەبەخشێت تەنانەت بەبێ ئەوەی داوای لێ بکەین
بەدڵنیاییەوە دەبەخشێت کاتێک داوای لێ دەکەین.

If a person's word can
temporarily heal you,
imagine what Allah's words
can do to you!



ئەگەر وشەی کەسێک بتوانێت
بەشێوەیەکی کاتی چاکت بکات،
بیهێنە بەرچاوت کە وشەکانی خودا
دەتوانێت چیت بۆ بکات!

Appreciate the food your
mother cooks for you.
Some don't have food and
some don't have mothers.



بەهای ئەو خواردنە بزانە
کە دایکت بۆت لێ دەنێت،
هەندێک کەس خواردنیان نییە و
هەندێکیش دایک.

## If Allah

can turn night into day,
then he can surely turn
your burdens into a blessing.



[illegible]

Your rizq will come your way
no matter who tries to stop it.
Just do your best and have
tawakkul in Allah.



[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]

Allah made you a Muslim
because He wants to see you in Jannah.
All you have to do, is prove that.
You are worthy of it.



خودا تۆی بە موسوڵمان کرد
لەبەر ئەوەی دەیەوێت لە بەهەشت بتبینێت.
تەواوی ئەوەی دەبێت بیکەیت ئەوەیە
کە بیسەلمێنیت شایەنی ئەوەیت.

Pray your daily Salah,
be good to your parents,
avoid sins
and see how your life changes
for the goods.



ڕۆژانە نوێژەکانت بکە،
لەگەڵ دایک و باوکت باش بە،
لە گوناهەکان دوور بکەرەوە
و ببینە چۆن ژیانت بەرەو باشی دەڕوات.

Allah is with you now and always.
Trust that He will remove each of
your worries very soon.



خودا ئێستا و هەمیشە لەگەڵتایە.
متمانەی پێ بکە هەموو نیگەرانییەکانت
بەزوویی لا دەبات.

No one can destroy the plan
that Allah has for you.



هیچ کەسێک ناتوانێت ئەو پلانە تێک بشکێنێت
کە خودا بۆی داناویت.

If your intentions are to please Allah
then you will be granted your reward.
But if your intentions are to show off
your good deeds, then you won't receive anything.



ئەگەر نیەتت ڕازیکردنی خودا بێت
ئەوا پاداشت دەدرێتەوە.
بەڵام ئەگەر نیەتت دەرخستنی چاکەکانت بێت
ئەوا هیچ پاداشتێک نادرێتەوە.

Things to remember:
Allah is always with you.
Allah will make a way for you.
Dua can change any situation.
Trust Allah's timing.



شتەکان بۆ بیرهێنانەوە:
خودا هەمیشە لەگەڵ تۆدایە.
خودا ڕێگات نیشان دەدات.
دەکرێت دوعاکردن هەر بارودۆخێک بگۆڕێت.
بڕوات بە کات دانانی خودا هەبێت.

Allah will open a door
that you desperately thought
never even had a key.



خودا دەرگایەک دەکاتەوە
کە تۆ بە بێئومێدی پێت وابوو
کە هەرگیز کلیلی نەبووە.

In the end Allah will save the relationships with those who deserve to be in your life.



لە کۆتایدا خودا ئەو پەیوەندیە
دەپارێزێت لەگەڵ ئەو کەسانەی
کە شایەنی ئەوەیان هەیە لە ژیانتابن.

Halal is not just what we eat,
but also what we wear and what we love.



حەلال تەنها ئەو شتە نییە کە ئێمە چی دەیخۆین،
هەروەها ئەو شتەیە کە
ئێمە چی دەیپۆشین و چیمان خۆشدەوێت.

*One who remembers Allah*
*is never lonely.*



کەسێک کە خودای لەبیر بێت
هەرگیز بەتەنیا نیە.

This dunya is not a resting place.
It's a testing place.



ئەم دونیایە شوێنی پشودان نییە،
شوێنی تاقیکردنەوەیە.

Allah tests us with what we love.



خودا بەو شتانەی کە خۆشمان دەوێت تاقیمان دەکاتەوە.

Smile and say Alhamdulillah
your life is better than millions.



زەردەخەنە بکە و بڵێ سوپاس خودایە
ژیانی تۆ لە ژیانی ملیۆنان کەس باشترە.

Perhaps a short time of pleasure
brings about a long time sorrow.



لەوانەیە کاتێکی کەم لە خۆشی
خەم و ناخۆشییەکی درێژخایەن بهێنێت.

No person can hold you back when Allah has decided to rise you up.



هیچ کەسێک ناتوانێت تۆ بگەڕێنێتەوە دواوە
کاتێک خودا بڕیاری دابێت بەرەو پێشەوەت بیات.

If Allah is making you wait,
then be prepared to receive
more than what you asked for.



ئەگەر خودا لە چاوەڕوانیدا هێشتیتیەوە،
ئەوا ئامادە بە بۆ ئەوەی زیاترت پێ ببەخشێت
لەوەی کە داوات کردووە.

Be careful with your words
you never know how many times
It keeps repeating in somcon's mind.



ئاگاداری وشەکانت بە
تۆ هەرگیز نازانیت چەند جار
لە مێشکی کەسێکدا دووبارە دەبێتەوە.

When you fall in love
with Allah,
the difficulties of life
become easy.



کاتێک عاشقی
خودا دەبیت،
سەختییەکانی ژیان
ئاسان دەبن.

Allah can change the most
hopeless situation
into the best moment in your life.



خودا دەتوانێت بێهیواترین
باروودۆخی ژیانت بگۆڕێت بۆ
باشترین سات لە ژیانتدا.

Imagine
how many times
Allah has saved you from something and you
literally have no idea,
Subhan Allah.



بیهێنە بەرچاوت
خوای گەورە چەند جار لە شتێك پاراستویتی و
کە خۆت هیچ ئاگاداری نەبویت.
سبحانە اللە.

Make sure you are the one
who teaches your child Surah Al Fatiha.
You will get the reward for every prayer.



دڵنیا ببەرەوە لەوەی ئەو کەسەیت کە
منداڵەکەت فێری سورەتی فاتیحە دەکەیت.
پاداشتی هەموو نوێژێکی وەردەگریت.

The bravest heart is the one
that stays close to Allah,
even, when it's in pain.



ئازاترین دڵ ئەو دڵەیە کە
لە نزیک خودا دەمێنێتەوە،
تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە ئازاردایە.

Never give up on yourself!
Even when things seem difficult,
be patient,
make Dua,
work hard and rely on Allah.



هەرگیز کۆڵ مەدەوا
تەنانەت کاتێک کە شتەکان قورس دیارن،
ئارام بگرە،
دوعا بکە،
کاری جدی بکە و پشت بە خودا ببەستە.

Teach your children Quran,
Quran will teach them everything.



منداڵەکانت فێری قورئان بکە،
قورئان هەموو شتێکیان فێر دەکات.

And never think that Allaah
is unaware of what the wrongdoers do.
He only delays them for a day
when eyes will stare [in horror]



هەرگیز وا بیر نەکەیتەوە کە خودا
بێئاگایە لە خراپەکاران کە چی دەکەن،
ئەو تەنها دوایان دەخات بۆ ڕۆژێک
کە چاوەکان تیایدا ئەبلەق دەبن (لە ترس و تۆقیندا).

You knock - Allah opens
You attend - Allah welcomes
You ask - Allah gives
You repent - Allah forgives
You cry - Allah listens.



لە دەرگا دەدەیت- خودا دەیکاتەوە

ئامادە دەبیت- خودا بەخێرهاتنت دەکات

داوا دەکەیت- خودا دەیبەخشێت

پەشیمانی دەردەبڕیت- خودا دەتبەخشێت

دەگریت- خودا گوێ دەگرێت.

When you find yourself in a position
to help someone, be happy because
Allah is answering that person's prayer through
you.



کاتێك خۆت لە شوێنێکدا دەبینیت کە یارمەتی
کەسێك دەدەیت دڵخۆشبە
لەبەر ئەوەی خودا لە ڕێگەی تۆوە وەڵامی نزاکانی ئەو کەسە
دەداتەوە.

Being a Muslim doesn't mean
you will never have problems,
means you have Allah who is
greater than all problems you face.



مسوڵمانبوون مانای ئەوە نییە کە
هەرگیز کێشەت نەبێت،
مانای ئەوەیە خودای گەورەت هەیە کە
لە هەموو ئەو کێشانەی ڕووبەڕووت دەبنەوە گەورەترە.

I am a Muslim, Islam is perfect,
but I am not.
If I make a mistake,
blame it on me, not on my religion.



من مسوڵمانم، دینی ئیسلام بێکەموکوڕییە،
بەڵام من نا،
ئەگەر هەڵەیەکم کرد،
لۆمەی من بکەن نەک ئایینەکەم.

I know I'm not the best,
But I'm going to fight my whole
life trying to get closer to Allah
because I don't want to lose His love.



من دەزانم باشترین نیم،
بەڵام لە هەموو ژیانم دەجەنگم و
هەوڵدەدەم لە خودا نزیك بمەوە،
لەبەر ئەوەی نامەوێت خۆشەویستیەکەی لەدەست بدەم.

Happiness will never come to those who
fail to appreciate the blessings they
already have.
Say Alhamdulilah
every moment in your life.



بەختەوەری هیچ کاتێک نایەت بۆ ئەوانەی کە
ناتوانن سوپاسگوزاری ئەو شتانە بن کە هەیانە.
هەموو ساتێک لە ژیانتا
سوپاسگوزاری خودا بە.

Alhamdulillah
The only saying on earth that
has the power to make you step back
and take a good look at what you gained,
and what not you lost.



سوپاس بۆ خودا
تاکە وتەیە لەسەر زەوی کە توانای ئەوەی
هەیە هەنگاوێک بتگەڕێنێتەوە دواوە
و سەیربکەیت کە چیت بەدەست هێناوە و
چیت لەدەست نەداوە.

When you don't have knowledge
someone could bring you dirt and
you will believe it to be gold.



کاتێک زانیاریت نییە
کەسێک دەتوانێت پیسیت بۆ بهێنێت و
تۆ باوەڕ دەکەیت کە زێڕ بێت.

As long as you pray,
you knock on the door of Allah.
And whoever knocks at the door of Allah,
He will open it for him.



بەدرێژایی ئەو کاتانەی نزا دەکەیت،
لە دەرگای خودا دەدەیت،
هەرکەسێک لە دەرگای خودا بدات،
ئەو بۆی دەکاتەوە.

As Muslims,
we must not only rely on our knowledge of the religion,
but we must also reflect it through our character.



وەک مسوڵمان،
ئێمە نابێت تەنها پشت بە زانیاری خۆمان ببەستین لەسەر ئاینەکە،
بەڵکوو دەبێت لە کەسایەتیی خۆمانەوە ڕەنگ بداتەوە.

Sadness that brings you back to Allah
is better than happiness that takes you
away from him



خەمبارییەک کە بتگەڕێنێتەوە بۆ لای خودا
باشترە لە دڵخۆشییەک کە دورت بخاتەوە لێی.

Allah puts people in your life for a reason and removes them from your life for a better reason.



خودا بە هۆکارێک مرۆڤەکان دەخاتە ژیانتەوە و
بە هۆکارێکی باشتر لە ژیانت لایان دەبات.

There's no pain Allah doesn't understand,
there's no struggle Allah doesn't know,
there's no cry Allah ignores.



هیچ ئازارێک نییە کە خودا لێی تێنەگات،
هیچ کۆششێک نییە کە خودا نەیزانێت،
هیچ گریانێک نییە خودا ئیهمالی بکات.

Being positive doesn't mean
you choose to ignore life's problems.
It means you trust Allah will find a way
out if you do your best.



ئەرێنیبوون مانای ئەوە ناگەیەنێت
هەڵیبژێریت کە تۆ کێشەکانی ژیانت پشتگوێ بخەیت،
مانای ئەوەیە تۆ متمانەت بە خودایە کەرێگایەک بدۆزێتەوە
ئەگەر هەوڵی تەواوەتی خۆت بدەیت.

If you really care for yourself,
Then let your heart find peace
By reciting or listening to the Quran.



ئەگەر بەڕاستی گرنگی بە خۆت دەدەیت،
ڕێگە بە دڵت بدە ئاسودەیی بدۆزێتەوە
بە خوێندنەوە یان گوێگرتن لە قورئان،

In the end you will come to realize
that nobody kept their promises
but Allah.



لە کۆتاییدا ئەوەت بۆ دەردەکەوێت
کە هیچ کەسێک جگە لە خودا
ڵێنەکانی جێبەجێ ناکات.

The beauty of sujud is,
you whisper down on earth
and It's heard up in the heaven.



جوانیی سوجدە لەوەدایە،
تۆ بە زەویدا دەچرپێنیت و
لە ئاسماندا دەبیسترێت.

The crying of the sinner is more
beautiful to Allah than the tasbeeh
of the arrogant.



گریانی گوناهکارێک بۆ خودا
زۆر جوانترە لە تەزبیحی لوتبەرزێک.

Allah has a purpose for your pain,
a reason for your struggles, and
a reward for your patience.
Don't give up.



خودا مەبەستێکی هەیە لە ئازارەکەت
هۆکارێک بۆ تێکۆشان و ناڕەحەتییەکانت،
پاداشتێک بۆ ئارامگرتنەکەت.
کۆڵ مەدە.

When you get what you want
that's Allah's direction.
When you don't get what
you want that's Allah's protection.



کاتێک ئەو شتەی کە دەتەوێت بەدەستی دەهێنیت
ئەوە ئاراستەی خودایە.
کاتێک ئەو شتەی کە دەتەوێت و بەدەستی ناهێنیت
ئەوە پاراستنی خودایە (خودا دەتپارێزێت).

Sometimes a single Sujood to Allah,
heals all the pain.



هەندێک کات
تەنها سوجدەیەک بۆ خودا
دەبێتە هۆی چاکبونی هەموو ئازارەکان.

What is meant for you will only be for you.
And what is written to be yours,
can never go to someone else.



ئەوەی بڕیار درابێت بۆ تۆ بێت تەنها بۆ تۆ دەبێت،
ئەوەیش نوسرابێت بۆ تۆ بێت،
هەرگیز نابێت بە هی کەسێکی تر.

## Allah says:

“Take one step towards Me,
I will take ten steps towards you,
Walk towards Me, I will run towards you”.



## خودا دەفەرموێت:

"یەک هەنگاو بەرەو من وەرە، من دە هەنگاو بەرەو تۆ دێم.
بەرەو ڕووم وەرە، من بەرەو ڕووت ڕادەکەم".

The more you'll ask,
the more Allah will guide you.
The more you'll ask,
the more He will give.



تا زیاتر پرسیار بکەیت،
خودا زیاتر ڕێنوێنیت دەکات.
تا زیاتر داوا بکەیت،
ئەو زیاترت پێ دەبەخشێت.

The most beautiful thing is that
He knows what you are about to
tell Him and yet He still listens.



جوانترین شت ئەوەیە
کە ئەو دەزانێت تۆ بەتەمای چی بەو بڵێیت و
هێشتاش ئەو گوێت لێ دەگرێت.

When the time is right,
you will understand
and thank Allah for His beautiful plan.



کاتێک کە کاتەکە ڕاست و گونجاوە،
تێدەگەیت و سوپاسی خودا دەکەیت
بۆ پلانە جوانەکەی.

## life is temporary.

If Allah created you for this world,
He would have created you without death.



## ژیان کاتییە.

ئەگەر خودا بۆ ئەم ژیانە دروستی کردبایت،
ئەو بە جۆرێک دروستی دەکردیت کە نەمریت.

If you want to talk to Allah, perform Salah.
If you want Allah to talk to you, read Quran.



ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ خودا قسە بکەیت، نوێژ بکە.
ئەگەر دەتەوێت خودا قسەت لەگەڵ بکات، قورئان بخوێنە.

Whoever has knowledge about
the names of Allah and His attributes
and actions will love Him without a doubt.



هەرکەسێک زانیاری لەسەر ناوەکانی خودا و
خەسڵەت و کارەکانی هەبێت ئەوا بێ گومان ئەوی خۆشدەوێت.

Never leave your Salah for anything,
that is your key to Jannah.



هەرگیز نوێژەکانت بۆ هیچ شتێک جێ مەهێڵە،
چونکە کلیلی چوونە بەهەشتی تۆیە.

If you find a darkness in your heart
after you sinned, know then
that in your heart there is light,
because of this light you felt the darkness.



ئەگەر هەستت بە تاریکییەک کرد لە دڵتدا دوای
ئەوەی گوناهێکت کرد، ئەوە بزانە کە لە دڵتدا ڕووناکییەک هەیە،
بەهۆی ئەو ڕووناکییەوە هەستت بەو تاریکییە کردووە.

Allah doesn't want us to be free from sin.
If that was the case,
He would've created us like that.
What He wants is for us to ask for
forgiveness after sinning.



خودا نایەوێت ئێمە بێتاوان بین،
ئەگەر بەو جۆرە بوایە،
بەو شێوەیە دروستی دەکردین،
ئەوەی دەیەوێت بۆ ئێمە ئەوەیە
کە دوای تاوانکردن داوای بەخشین بکەین،

To most beautiful blessing
we have been given is the chance
to repent.



جوانترین ڕەحم و بەرەکەتێک کە
پێمان بەخشراوە ئەوەیە کە
هەلی تەوبەکردنمان هەیە.

Strange is the relationship with Allah,
we sin as if He sees nothing, and He forgives
as if He saw nothing.



سەیر و سەمەرەیە پەیوەندی لەگەڵ خودای گەورەدا،
ئێمە تاوان دەکەین گوایە ئەو هیچ نابینێت،
ئەو لێمان خۆش دەبێت گوایە کە هیچی نەبینیبێت.

If you feel the pain of guilt for the
sins you committed, then rejoice.
Your heart is still alive.
Allah has still given you consciousness of Him
and an opportunity to repent by His grace.



ئەگەر هەستت بە ئازاری تاوان کرد
بەهۆی ئەو گوناهانەی ئەنجامت دان،
ئەوا دڵخۆش بە، دڵی تۆ هێشتا زیندووە.
خودای گەورەش تا ئێستا بە رەحمی خۆی و
دەرفەتی تۆبەی بۆ بەخشیوین.

Most sins are a result of unnecessary speech and looking at impermissible things.



زۆربەی گوناهەکان دەرئەنجامی قسەی نابێویست و سەیرکردنی شتە ناڕەواکانن.

Sins arc like dreams,
you could enjoy the dream,
but then you have to wake up and
live the consequences of sin in reality.



گوناهەکان وەک خەوبینین وان،
دەتوانیت چێژ لە خەو ببینیت.
بەلام دواتر دەبێت هەستیت و
لە ئەنجامەکانی گوناح لە واقیعدا بژیت.

Sins have many side effects,
one of them is that they steal knowledge
from you.



گوناحکردن کاریگەریی لاوەکیی زۆری هەیە،
یەکێک لە کاریگەرییەکانی ئەوەیە کە زانیاریت لێ دەدزێت.

Feeling guilty about your sins
is indicative of much goodness.
This is how the believer is:
he loves Allah,
hopes for His mercy
and fears His punishment.



هەستکردن بە تاوان دەربارەی گوناهەکانت
نیشاندەرێکی باشی زۆرە،
بەڕاستی ئیماندار بەو شێوەیەیە:
خودای خۆش دەوێت،
هیوای ڕەحمەت و میهرەبانیی ئەو دەخوازێت
و لە سزای ئەو دەترسێت.

Sins slowly kill the heart,
and abandoning sins brings life to the heart.



گوناهەکان بەهێواشی دڵ دەکوژن،
وازهێنان لە گوناهەکان دڵ دەبووژێنێتەوە.

## Dear Allah

forgive me all my sins, great and small,
the first and the last,
those that are apparent and those that are hidden.
Ameen.



## خوایە گیان

لە هەموو گوناهەکانم خۆش بە، گەورە و بچووک،
یەکەم و کۆتام.
ئەوانەی کە بەئاشکرا بووە و ئەوانەشی کە بەنهێنی بووە.
ئامین.

When we demonstrate our
faith in Allah by our obedience,
He not only promises to provide for us,
He will provide.



کاتێک بە گوێڕایەڵیمان
ئیمان و باوەڕمان پیشانی خودا دەدەین،
ئەو تەنها بەڵێن نادات پێمان ببەخشێت،
ئەو پێمان دەبەخشێت.

Allah still shows mercy to those which disobey Him. Imagine how much he loves those who obey him.



خودا هێشتا بەزەیی پیشانی ئەو کەسانە دەدات کە گوێڕایەڵیی ناکەن،
بیهێنە بەرچاوت دەبێت چەنێک ئەوانەی خۆش بوێت کە گوێڕایەڵیی دەکەن.

Know that you will never truly love Allah until you love obeying Him.



بزانە کە هەرگیز بەڕاستی خودات خۆش ناوێت گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی نەکەیت.

Life is but a moment.
Let it be a moment of obedience to Allah.



ژیان تەنها ساتێکە.

با ساتێک بێت لە گوێڕایەڵیی خودا.

## Never forget

that you will be rewarded
for every nafs you fight off
in order to please Allah.
Even the ones you are not aware of.



## هەرگیز لەبیرتان نەچێت کە

پاداشتی هەموو ئەو نەفسانە دەدرێت کە دەجەنگن
بۆ ئەوەی خودا ڕازی بکەن،
تەنانەت ئەوانەشی کە ئاگات لێی نییە.

If you want an enemy,
the nafs is sufficient.
If you want advice,
death is sufficient.



ئەگەر دوژمنت دەوێت،
نەفس بەسە،
ئەگەر ئامۆژگاریت دەوێت،
مردن بەسە.

Your worst enemy is
hiding within yourself,
and that enemy is your nafs.



خراپترین دوژمنت
لە ناو خۆتدا خۆی حەشار داوە،
ئەو دوژمنەش نەفسی خۆتە.

## Your nafs

if you do not
keep it busy with truth,it will
keep you busy with falsehood.
Imam Al Shafi.



## نەفسی خۆت

ئەگەر سەرقاڵی نەکەیت بەڕاستی و حەقیقەتەوە.
ئەوا ئەو بە درۆ سەرقاڵت دەکات.
ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

Always remember.
Fighting our own nafs
is the greatest Jihad.



[illegible]
[illegible]
[illegible]

My nafs screams out
for what it desires.
But my will to be free
screams louder.



نەفسم هاوار دەکات
بۆ ئەو شتەی حەزی لێیەتی.
بەڵام ئیرادەی من ئازادە
بەرزتر هاوار دەکات.

**If you are not**
**battling your nafs,**
**know that it's already**
**wining the battle.**



ئەگەر تۆ شەڕی نەفست نەکەیت،
ئەوە بزانە کە ئەو
جەنگەکەی بردووەتەوە.

If you let the dunya feed you,
you will always be starving.



ئەگەر ڕێگا بدەیت دونیا خواردنت بۆ بدات،
ئەوە هەمیشە برسی دەبیت.

## nafs

The battle that
never ends.....
Control it
before it controls you.



## نەفس

ئەو جەنگەیە
کە هەرگیز کۆتایی نایەت...
کۆنترۆڵی بکە پێش ئەوەی کۆنترۆڵت بکات.

Fight shaytan,
fight your nafs,
don`t let anything bring you down,
Allah is with you.



شەڕی شەیتان بکە،
شەڕی نەفس بکە،
مەهێڵە هیچ شتێک بتهێنێتە خوارەوە،
خودا لەگەڵ تۆدایە.

To have peace of mind,
you must go to war with your
nafs. Control your nafs,
before it destroys you.



بۆ ئەوەی مێشکێکی ئارامت هەبێت،
لەگەڵ نەفست بجەنگێ.
کۆنترۆڵی نەفست بکە،
پێش ئەوەی لەناوت ببات.

Your nafs is your first battlefield.
If you are victorious over it,
then you will find the other
battlefields easier.



نەفست یەکەم مەیدانی جەنگی خۆتە،
ئەگەر سەرکەوتیت بە سەریدا،
مەیدانی جەنگەکانی تر ئاسانتر دەبێت بۆت.

A woman's beauty is not in her features,
the shade of her skin, or her possessions.
True beauty is in her heart, her iman,
her taqwa and love for her deen.
So few men understand this.
Even fewer women do.



جوانیی ئافرەت لە تایبەتمەندییەکانی،
سێبەری پێستی، یان سامانەکانیدا نییە.
جوانیی ڕاستەقینە لە دڵیدایە، لە ئیمان و
تەقوا و خۆشەویستیی بۆ دینەکەیدایە.
زۆر کەم پیاو لەمە تێدەگەن.
تەنانەت ئافرەتانێکی کەمتریش تێدەگەن.

Islam has raised the status of
woman from below the earth
to so high that paradise lies at her feet.



ئیسلام پێگەی ئافرەتی لە ژێر زەوییەوە
بەرز کردووەتەوە تا شوێنێک کە
بەهەشت لە ژێر پێیدایە.

Everything precious is covered!
A woman modestly dressed is like a pearl in it's shell.



هەموو شتێکی بەنرخ داپۆشراوە!
ئافرەتی داپۆشراو وەک مرواری وایە لەناو قەباخەکەیدا.




If a woman has the right
to show of what she has,
then she also has the right to cover it up too.



ئەگەر ئافرەتێک مافی ئەوەی هەبێت
ئەوەی هەیەتی دەریبخات،
هەروەها مافی ئەوەشی هەیە ئەوەی
هەیەتی دایپۆشێت.

# Hijab is beautiful,

so make it look beautiful,
wear it with love,
wear it with pride and
most of all wear it right.



# حیجاب جوانە،

لەبەر ئەوە جوانی بکە،
بە خۆشەویستییەوە لەبەری بکە،
بەشانازییەوە لەبەری بکە و
لە هەمووی گرنگتر بە شێوەیەکی دروست لەبەری بکە.

The sun doesn't lose its beauty
when covered by the clouds.
The same way your beauty
doesn't fade when being covered by hijab.



خۆر جوانییەکەی ون نابێت کاتێک
بە هەورەکان دادەپۆشرێت.
بەهەمان شێوە جوانییەکەت ون نابێت
کاتێک حیجاب لەبەر دەکەیت.

No woman in this world
is prettier than a Muslimah
who dress to pleas Allah.
the beauty is on her iman instead of her face.



هیچ ئافرەتێک لەم جیهانەدا
بەقەدەر ئەو ئافرەتە جوان نییە
کە لەپێناو ڕەزامەندیی خودادا
خۆی دادەپۆشێت.
جوانییەکەی لە ئیمانیدایە نەک لە ڕووخساریدا.

**Fatima(R.A)**

A womans besl jewelry
is her shyness.



**فاتیمە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) فەرموویەتی:**

باشترین گەوهەری ئافرەت، شەرمەکەیەتی.

Beautify your character,
others start looking at you with their hearts
and not eyes.



کەسایەتیت جوان بکە
ئەوان بە دڵ سەیری تۆ دەکەن
نەک بە چاویان.

## Prophet Muhammad said (PBUH):

Haya(modesty) does not bring anything except good.



پێغەمبەر موحەمەد(درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی:

حەیا جگە لە باشە (چاکە) هیچ شتێکی تر ناهێنێت.

Haya and iman
are two that go together.
if one is lifted,
the other is also lifted.



حەیا و ئیمان
دوو شتن پێکەوەن
ئەگەر یەکێکیان نەمێنێت،
ئەوەی تریشیان نامێنێت.

Sometimes we make dua for a door
of the dunya.
When it doesn't open, we cry.
Not realizing that Allah has
instead opened a door of Jannah for us.



هەندێک جار دوعا دەکەین بۆ کردنەوەی
دەرگایەکی دونیا.
کاتێک ناکرێتەوە، دەگرین.
بەوە نازانین کە خودا لەجیاتی ئەو دەرگایە
دەرگایەکی بەهەشتی بە ڕووماندا کردووەتەوە.

## Dear Allah,

If I lose hope today,
please remind me that your plans are
better than my dreams.



## خوایە گیان،

ئەگەر ئەمڕۆ هیوام لەدەست داوە، تکایە
وە بیرم بهێنەرەوە کە پلانەکانی تۆ باشترن
لە خەونەکانی من.

## Dear Allah,

Sometimes its hard for me
to understand what you relay
want to happen
but I trust you
I know you will give me what's best.



## خوایە گیان،

هەندێک کات قورسە بۆ من کە تێبگەم
تۆ دەتەوێت چی ڕووبدات بەڵام
من باوەڕم پێتە
دەزانم کە تۆ باشترین شتم بۆ دەبەخشیت.

When you don't understand
what's happening in your life,
just close your eyes,
and take a deep breath and say,
Ya Allah, I know this is your plan,
just help me through it.



کاتێک تێناگەیت لە ژیانت چی ڕوو دەدات،
تەنیا چاوەکانت دا بخە و هەناسەیەکی قووڵ
هەڵمژە و بڵێ:
خوایە گیان دەزانم ئەمە پلانی تۆیە،
تەنیا یارمەتیم بدە کە تێیبپەڕێنم.

Every dua is heard.
Every dua is answered.
But in different ways.
Allah knows what you know not.
Allah can see what you can't.
So,trust Him.
He loves you and He will
bless you with the best.



هەموو دوعایەک دەبیسترێت.
هەموو دوعایەک وەڵام دەدرێتەوە.
بەڵام بە شێوازی جیاواز.
خودا دەزانێت کە تۆ چی نازانی.
خودا دەبینێت کە تۆ چی ناتوانیت.
لەبەر ئەوە، باوەڕت پێی بێت.
ئەو تۆی خۆش دەوێت و بە
باشترین شێوە ڕەحمەت بۆ دەکات.

The power of dua can do so much,
believe in Allah's timing.
you may be hurting at the moment
but trust in him, have faith.
He will give you what you deserve
when the time is right, sabr is everything.



هێزی دوعا دەتوانێت زۆر شت بکات،
باوەڕت بە کاتەکانی خودا هەبێت.
ڕەنگە لەم ساتەدا لە ئازاردا بیت
بەڵام باوەڕت پێی هەبێت.
لەکاتی گونجاودا ئەوەت پێ دەبەخشێت
کە شایەنیتی، سەبرگرتن هەموو شتێکە.

Always make dua, because
Allah can change your life
in one second.



هەمیشە دوعا بکە، چونکە
خودا دەتوانێت لە یەک چرکەدا
ژیانت بگۆڕێت.

## Dear Allah,

If I am wrong, correct me.
If I am lost, guide me.
If I start to give up,
keep me going.



## خوایە گیان،

ئەگەر هەڵەم، ڕاستم بکەرەوە.
ئەگەر ون بووم، ڕێم نیشان بدە.
ئەگەر خەریکە کۆڵ دەدەم، بەردەوامیم پێ ببەخشە.

Never give up on making dua,
especially in times of need
Allah always listens,
something is takes a little long to get an answer.
But that's because Allah is testing your patience.



هەرگیز واز لە دوعاکردن مەهێنە،
بەتایبەتی لەو کاتانەی کە پێویستتە
خودا هەمیشە گوێ دەگرێت،
شتێک کەمێک وەڵامی دوعاکەت دوا دەخات،
بەڵام ئەوە لەبەر ئەوەیە کە خودا
ئارامگرتنت تاقی دەکاتەوە.

## Ya Rabb, Ya Karim,

Whoever wishes good
for me in the secrecy of the night or in the openness of daylight, grant them double of what they have wished for me.
And whoever wishes harm to touch me, pardon them and stretch distance and forgiveness between us.



## یا ڕەب، یا کەریم،

ئەوەی لە نهێنیی شەودا یان ڕۆشنایی ڕۆژدا،
هیوای باشی بۆ خواستووم، دوو ئەوەندەی
کە ئاواتی بۆ خواستووم پێی ببەخشە.
ئەوەی دەیەوێت زیانم پێ بگەیەنێت،
لێی ببورە و دووری و لێبوردەیی
لە نێوانمان درێژ بکەرەوە.

## Ya Allah,

Make the day I stand before you
the most beautiful day of my life.



## خوایە گیان،

ئەو ڕۆژە بکە بە جوانترین ڕۆژی ژیانم
کە لەبەردەم تۆدا ڕادەوەستم.

Allah doesn't leave any dua unanswered.
When the time is right,
He will give us much more than we asked
for and far more than we deserve.
No matter how successful you get,
never stop being grateful.
Because as quick as Allah gave it to you,
He can surely take it away.



خودا هیچ دوعایەک بەبێ وەڵام ناهێڵێتەوە
کاتێک کاتەکە گونجاوە،
ئەو زیاتر لەوەی کە داوامان کردووە پێمان دەبەخشێت و
زیاتر لەوەی کە شایەنین.
گرنگ نییە چەند سەرکەوتوو بیت،
هەرگیز سوپاسگوزاریی خودا لە یاد مەکە،
لەبەر ئەوەی چەند بەخێرایی خودا پێی بەخشیت،
بەدڵنیاییەوە دەتوانێت لێت بسەنێتەوە.

## Ya Allah,

Surround me with
those who remind me of you.
Imagine Allah forgives you
and takes you in to Jannah,
because You were the cause for
your friend to repent.



## خوایە گیان،

ئەو کەسانە بهێنە دەوروبەرم
کە تۆم بیر دەهێننەوە.
بیهێنە بەرچاوت کە خودا دەتبەخشێت و
دەتخاتە بەهەشتەوە، لەبەر ئەوەی تۆ
هۆکاری تەوبەکردنی هاوڕێکەت بویت.

Allah may not answer your dua
in the way you want, but
He'll always answer in the
best way that you need.



خودا لەوانەیە وەڵامی دوعاکەت
بەو شێوەیە نەداتەوە کە تۆ دەتەوێت،
بەڵام هەمیشە بە باشترین شێوە
وەڵامت دەداتەوە کە تۆ پێویستتە.

A dua for my mother:
May every tear that has ever fallen
from your tired eyes on my behalf
become a river for you in Jannah.



دوعایەک بۆ دایکم:

هەرچی فرمێسکێک کە لە چاوە ماندووەکانت
کەوتووەتە خوارەوە بۆ سوود و پەروەردەکردنی من
ببێت بە ڕووبارێک لە بەهەشت بۆت.

A dua to my father:
May every drop
of your sweat fallen,
in bringing me up
become a river in Jannah.



دوعایەک بۆ باوکم:
هەر دڵۆپە ئارەقێک کە لە تۆ کەوتبێت
بۆ گەورەکردن و پێگەیاندنی من
ببێت بە ڕووبارێک بۆت لە بەهەشت.

Even if you think it's impossible or unrealistic.
Pray. Because every dua can change qadr,
and every dua shows you have faith in your
creator even when you think it isn't possible.



تەنانەت ئەگەر پێت وایە ئەوە مەحاڵە یان ناواقیعییە
دوعا بکە چونکە هەموو دوعایەک دەتوانێت قەدەر بگۆڕێت
و هەموو دوعایەک ئەوە نیشان دەدات کە باوەڕت بە
دروستکەرەکەت
هەیە تەنانەت کاتێک کە پێت وایە کە ناکرێت.

Allah puts so much barakah in your time
when you're punctual in offering your prayers.
When you respect the Creator of time,
He makes time work in your favor.
May Allah put barkah in every minute of our days.



خودا بەرەکەت دەخاتە کاتەکانتەوە کاتێک
لە کاتی خۆیدا نوێژەکانت ئەنجام دەدەیت.
کاتێک کە تۆ ڕێز لە دروستکەری کات دەگریت،
ئەو کات بە قازانجی تۆ دەکات.
خوای گەورە بەرەکەت بخاتە هەموو خولەکێکی ڕۆژەکانمان.

Trust in the power of dua
and never lose hope.
Allah will grant you everything you want
As long as it is good for you.



بڕوات بە هێزی دوعا هەبێت و
هەرگیز هیوا لەدەست نەدەیت.
خودا هەرچی دەتەوێت دەیبەخشێت
هەتا بۆت باش بێت.

# لە کۆتاییدا


سوپاسی نەبڕاوە بۆ خودای بەخشندە و میهرەبان کە یارمەتیدەرم بوو لەم کارەدا.

سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بە وشەیەکیش بووە یارمەتیان داوم لە کۆکردنەوە و وەرگێڕانی وتەکانی نێو ئەم کتێبەدا.

سوپاسی بێ پایان بۆ هاوڕێی منداڵیم مامۆستا حەیدەر ئیبراهیم کە ئەرکی پێداچونەوە و هەڵەچنیی کتێبەکەی لە ئەستۆ گرت.

سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە پێشنیاری خوێندنەوەی ئەم کتێبە بۆ هاوڕێ و کەسەکانیان دەکەن.



We are not promised a pain free life.
We are not promised a journey without waves.
We are promised that if we hold onto the rope of Allah, and stay within the lifeboat of His remembrance, nearness and mercy,
the waves will come.
But they will, never ever drown us.

ئێمە بەڵێنی ژیانێکی بێئازارمان پێ نەدراوە.
ئێمە بەڵێنی گەشتێکی بێ شەپۆلمان پێ نەدراوە.
ئێمە بەڵێنمان پێ دراوە گەر دەست بگرین بە فەرمانی خوداوە و لە بەلەمی ڕزگاری یادکردنی، نزیکی و ڕەحمی ئەودا بمێنینەوە،
شەپۆلەکان دێن.
بەڵام هەرگیزاوهەرگیز نوقممان ناکەن.

